# گفتوگۆیەک لەنێوان دایکی
# عەممارو خاتوو لاڤین



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ئەمە گفتوگۆیەکە لەنێوان دوو خاتوون دا کە یەکێکیان باڵاپۆشە(نیقاب)

ئەوی تیان سافرەیە سەرەتای گفتوگۆکە بەوە دەست پێدەکات کە ڕۆژێک (دایکی عەممار) و (خاتوو لاڤین) ڕێیان دەکەوێتە بازاربۆ کڕین شتو مەک لەکاتێکدا هیچ کامیان ئەوی تریان ناناسێت دایکی عەمماربە نیقابەکەیەوە بەبازاڕدا ڕێدەکات بەدوو کیسەی پڕلەمیوە لەناکاو دایکی عەممارکیسە میوەکانی لێ دەکەوێت و میوەکانی دەڕژێنە سەرزەویەکە لەولاوە ئافرەتێک دێت (خاتوو لاڤین) کاتێک دەبینێت میوەکانی دایکی عەممارڕژاونەتە سەرزەویەکە و دایکی عەمماریش خەریکی کۆکردنەوەیانە بە نیقابەکەیەوە

-پێی دەڵێ: خاتوون ئەو نیقابەی سەرت لادە تا جوان ڕێگاکە ببینی بەهۆی ئەوەوە پێشی خۆت نابینی، ئاگات لێیە میوەکانت هەمووی کەوتونەتە سەرزەویەکە بەهۆی ئەو پەردەیەی بەسەرچاوتەوەیە

( مەبەست نیقابەکەیە)

-دایکی عەممارزۆربەهێمنی هەڵدەستێتەوە و دێتە جواب ئەفەرموێ :

نیقابەکەم ڕێگرنیە لە ڕۆیشتنم بەڕێگادا، لەوانەیە بینینم کەمێک قورس بێت وە شتەکان بەڕوونی نەبینم، بەڵام لەکۆتاییدا سوپاسی خودا دەکەم کە سەربەرزم پێی فەزڵی خۆی بەسەردا ڕژاندم و فەرمانی جێبەجێدەکەم چونکە لەعنەتی خوام لەسەرنیە سوپاس بۆخوا

**کاتێک بە ڕێگادا دەڕۆم من لە عیبادەتدام تا دەگەڕێمەوە ماڵ وە بەبێ ئەوەی هیچ کەس توشی نەزەربێ بەهۆی منەوە و تاوانی کەس هەڵناگرم و خۆم توشی تاوان ناکەم تا دەگەڕێمەوە بەڵام خاتوون تۆ ڕاستە ڕێگاکە بەڕوونی دەبینی، بەڵام هەر لەوکاتەی لەماڵ دەرچوویتە دەربەو جل و بەرگانەوە تا دەگەڕێتەوە لەعنەتی اللە ت لەسەرە وە تاوانی هەموو ئەو کەسانەشت هەڵگرتووە جگە لە تاوانەکەی خۆت کە (سافرە)ی تا دەگەڕێیە ماڵەوە,چۆن شەرم ناتگرێ سەرپێچ فەرمانی اللە دەکەی!!!**

**وە ڕێگاکە بە جوانی دەبینی بەڵام لەگەڵ هەر هەنگاو نانێکت بە ڕێگادا بەو جلانە نەزەڕی سەدان کەس دێنیتە سەر خۆت**

**-خاتوو لاڤین لەوڵامدا دەڵێت :**

**جا تۆ حەقت چییە خاتوون، حەقی منت نەبێ من ئازادم هەرچی دەکەم و هەرچی لەبەردەکەم یەکجار دەژیم دەمەوێ بەخۆشی بژیم پڕبەدڵی خۆم بپۆشم و خۆم بڕازێنمەوە و لەبەربکەم...هتد**

**خۆ خوا خۆی دەفەرموێ زۆرکردن لەدیندا نیە ئیتر تێناگەم بۆچی تۆوادینت بە قورسی گرتووە، سەیرێکی خۆت بکە بەشەرلێت دەترسێت بەو جلانەوە دەڵێی تیرۆرستی**

دایکی عەممار:-

دیسانەوە بە حیکمەتەوە بەجواب هات پێی فەرمووە، ئایا دەگونجێت بە دایکمان عائیشە (رضی الله عنها) بڵێین تیرۆرست؟ خاتوو لاڤین: بێگومان نەخێر

دایکی عەممار: دەی منیش جلی دایکە عائیشەم پۆشیوە الله لێی رازی بێت

تۆ کە خۆت بە شوێنکەوتەی دایکە عائیشە دەزانی (رضی الله عنها) بۆ جلەکانت هیچ لەجلی دایکە عائیشەمان ناچێت؟ بۆ جلی ئەو لەبەرناکەی؟

ئایا هێشتا قەناعەتت نەهێناوە؟

یان ئەترسی لەقسەی خەڵک؟

لەکاتێکدا ئێمە خۆمان نین هەتا چاوڕێکەین تا ئەوکاتەی قەناعەتمان بۆدرووست بێ تا فەرمانی الله جێبەجێ بکەین، وە بزانە خوای گەورە زۆرشایستەترە لێی بترسی تا قسەی خەڵکی...

وە باش بزانە و خۆت دەربازمەکە بە بیانوی ئەوەی کە خوای تعالی دەفەرموێت (لا إكراه في الدين) کە هەرچی کاری خراپە و بێزراو هەیە دەیکەن لەژێرناوی ئەم ئایەتەدا پەنا بەخوای گەورە

وەدەڵێن زۆرکردن لە ديندا نیە ئێمە ئازادین!!

نەخێرخوشکی من باش بزانە نە من و نەتۆش کەسمان ئازاد نین وە موڵکی خۆمان نین تا بڵێین ئازادین و بەدڵی خۆمان بژین

بەڵکو موڵکی زاتێکین کە درووستی کردووین تەنها بۆ ئەوەی عیبادەتی بۆ بکەین و ببین بەکۆیلە و عەبدی ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە نەک بین بەکۆیلە و بەندەی هەوا و نەفسمان

موڵکی زاتێکین کە چۆنی بوێ و هەرچۆنی بوێ دەبێ بەو جۆرە بژین بەرنامە و یاسای ژیانی بۆ دیاری کردووین کە دەبێ پەیڕەوی ئەوە بکەین نە ئەو یاسا و بەرنامەیەی کە خۆمان دایدەنێین بۆ ژیانی خۆمان کە بەرەو تیاچوونمان دەبات پەنا بە الله

وە خوشکی ئەزیزم باش بزانە سەبارەت بەو ئایەتە (لا إكراه في الدين)

ئەم ئایەتە بەو مەبەستە نەهاتووە کە ئێوە باسی لێوەدەکەین ئازاد بن و بەدڵی خۆتان ژیان بەسەرببەن !!بەڵکو مەبەست لێی بریتیە لەوەی

ئەمە لەکاتێکدا لەوڵاتێکی (دار الإسلام)م دا بژین، وە خەڵکانێک لە ئەهلی کتاب لەو وڵاتەدا بن سەرەتا داوایان لێدەکرێ موسڵمان بن گەر موسڵمان نەبوون داوایان لێدەکرێ جزیە بدەن ، گەر جزیەیان دا ئەوە زۆریان لێ ناکرێ بۆ ئەوەی موسڵمان بن

ئێستا تێگەیشتی مەبەست لەم ئایەتەدا چییە خوشکی ئەزیزم؟

-خاتوو لاڤین :بەچاوێکی پڕ لە ئەسرین وە بەدڵێکی غەمبارەوە سەیری دایکی عەمماری کرد و پێی فەرموو بەڵێ زۆرباش لێت تێگەیشتم خوشکی من، ئا ئێستا زانیم من لەچی غەفڵەتێکدا ژیاوم چەند ساڵە....

تەمەنێکم بەسەربرد لەسەرپێچی الله بەنەکردنی پۆشاکی شەرعی و خۆدانەپۆشینم بە بیانوی ئەوەی دەموت من ئازادم چی دەکەم و چی ناکەم...ئەی خوشکەکەم خوا لێت رازی بێت خوای گەورە تۆی کردە سەبەبێک بۆ ئەوەی چاوم بکرێتەوە و گوێ بیستی ئەم شتانە بم، تخوا گەردنم ئازابکە وە داوای لێ خۆشبوونم بۆبکە لای الله تعالی من زۆر پەشیمانم...

ئەسرین لە چاوەکانی دەڕژا لەوکاتەدا

دایکی عەممار دەستی گرت و بە دەست کێشەکانی فرمێسکەکانی سڕی و پێی فەرموو گەردنت ئازابێت خوشکەکەم....

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ